زنجیرەی ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست

پاشکۆی ژ (٨)



## فەزڵ و گەورەیی و حوکمەکانی

# دە ڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیان لە سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)

## (فضائل وأحكام عشر ذي الحجة)

ئامادەکردنی

مامۆستا محمد عبدالرحمن لطيف

وتارخوێنی مزگەوتی (شێخ إبراهیم / کەلار)

چاپی حەوتەم

١٤٣٢ك

# فەزڵ وگەورەیی و حوکمەکانی
# دە ڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیان
# لە سوننەتی
# پیرۆزی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم)

## (فضائل وأحكام عشر ذي الحجة)


ئامادە کردنی :

ماموستا : محمد عبد الرحمن لطيف

وتارخوێنی مزگەوتی شێخ إبراهیم / کەلار

(بكالوريوس في العلوم الشرعية والدراسات الإسلامية / جامعة دهوك)



چاپی حەوتەم        ١٤٣٢ ك

ناوی نامیلکە : فەزڵ و گەورەیی و حوکمەکانی دە ڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیان لە سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەردا (ﷺ) .
ناوی نووسەر : مامۆستا محمد عبد الرحمن لطیف .
ژمارەی سپاردن : (٩١٩) .
نۆرەی چاپ : حەوتەم .
ساڵی چاپ : ١٤٣٢ ك - ٢٠١١ .
شوێنی چاپ : چاپەمەنی زانا / سلێمانی .
بنکەی بڵاوکردنەوە :
کتێبخانەی سوننە ــ سلێمانی .
کتێبخانەی پێشین ــ هەولێر .
کتێبخانەی زانستی بەسوود ــ کەلار .
کتێبخانەی سیما ــ چەمچەماڵ .

لە بڵاوکراوەکانی
کتێبخانەی زانستی بەسوود / کەلار

# پێشەکی چاپی شەشەم

بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار ئەوا بۆ جاری شەشەم ئەم نامیلەکەیە ئامادە دەکەمەوە بۆ چاپ لە پاش تەواو بوونی هەموو نوسخەکانی چاپەکانی پێشووی .. وە سوپاس بۆ خوای گەورە موسڵمانان بە هەموو چین و توێژەکانیانەوە بە گشتی و بە تایبەتیش میوانانیماڵەکانی خوا و خوێندکارانی قۆناغە جیاجیاکانی خوێندن لە قوتابیانی زانکۆ و پەیمانگا و دواناوەندیەکان لە هەردوو ڕەگەزەکە تێکرا پێی سوودمەند بوون و بەرچاوڕۆشنکەرەوە و هاندەرێکی باش بوو بۆیان بۆ ئەوەی ئاشنا ببن بە فەزڵ و سوننەتەکانی (**دە ڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیان**) و پاشان ئەو سوننەتانە ئەنجام بدەن و دروشمەکانی ئاینی خوا بەرزڕاگرن و خێر و فەزڵەکانی ئەو دە ڕۆژە بەدەست بێنن .

وە دەتوانم بڵێم : بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبە و هاوشێوەکانی هەوڵێکی مەزن و کاریگەر بوون بۆ زیندووکرنەوەی چەندین سوننەتی پشتلێهەڵکراو (سُنَنٌ مَهجُورة) لە سوننەتەکانی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) کە زەمانێکە بە هۆی نەزانین و بڵاوبوونەوەی خورافیات و فەرموودە لاواز و هەڵبەستراوەکانەوە پشتیان تێکرابوو !

داوا کارم خوای پەروەردگار بیکاتە زەخیرە و توێشووی قەبر و قیامەتمان .. اللّهم آمين .

**کتێبخانەی زانستی بەسوود / کەلار : (١ / ذو القعدة / ١٤٣١ ك)**

بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە هەندێك کاتی موبارەکی داناوە بۆ بەندە صالحەکانی کەوا بتوانن کرداری چاکی تێدا ئەنجام بدەن ، وە صەلات و سەلامیش لە سەر پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی بێت کە (**حوکم و ئادابەکانی**) کات و شوێنە پیرۆز و موبارەکەکانی ڕوون کردووەتەوە بۆ موسڵمانان ، هەروەها لە سەر هاوەڵ و شوێنکەوتووانی بە چاکە کە زیندوو کەرەوەی درووشمەکانی ئایینی خوا و سوننەتەکانی پێغەمبەرن (ﷺ) .

هەرچەندە تەمەنی موسڵمانانی ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) کەم تر و کورت ترە لە تەمەنی موسڵمانانی ئوممەتانی پێشووتر هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((أَعْمَارُ أُمَّتِي مَا بَيْنَ السِّتِّينَ إِلَى السَّبْعِينَ ، وَأَقَلُّهُمْ مَنْ يَجُوزُ ذَلِكَ))[1] .

واتە : تەمەنی ئوممەتەکەی من لە نێوان شەست تا حەفتا ساڵدایە ، وە کەمیان هەیە لە ئەوەندە تەمەنیان تێپەڕ بکات .

بەڵام خوای گەورە بە فەزڵی خۆی هەندێك کات و کرداری داناوە کەوا دەبێتە مایەی بەرەکەت و زیاد بوونی تەمەن ، جا لەو کاتە موبارەکانە : (**دە ڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیانە / عشر ذي الحجة**).

---

(١) صحيح سنن الترمذي رقم : (٣٥٥٠) وصحيح سنن ابن ماجه رقم : (٤٢٣٦) .

**بەڵگە لە سەر فەزڵ و گەورەیی ئەم دە ڕۆژە :**

١ - خوای گەورە لە قورئاندا سوێندی پێ خواردووە و فەرموویەتی : ﴿وَٱلْفَجْرِ ۝١ وَلَيَالٍ عَشْرٍ ۝٢﴾ [سورة الفجر] ، قال ابن كثير : (المراد بها عشر ذي الحجة).

واتە : مەبەست بەو دە (١٠) ڕۆژەی کە خوا سوێندی پێخواردووە بریتی‌یە لە **دە ڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیان** .

٢ - هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْلُومَٰتٍ ۝٢٨﴾ [الحج] ، قال ابن عباس (رضي الله عنه) : (أيام العشر) .

واتە : زیکری خوا بکەن لە ڕۆژە زانراوەکاندا کە بریتین لە **دە ڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیان** .

٣ - وە (سعيد بن جبير) دەگێڕێتەوە لە (ابن عباس)ـەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((مَا مِنْ أَيَّامٍ الْعَمَلُ الصَّالِحُ فِيهِنَّ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنْ هَذِهِ الأَيَّامِ الْعَشْرِ ، فَقَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلاَ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : وَلاَ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ إِلاَّ رَجُلٌ خَرَجَ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ فَلَمْ يَرْجِعْ مِنْ ذَلِكَ بِشَيْءٍ))[٢] .

واتە : هیچ ڕۆژانێك نی‌یە کردەوەی چاکە تێیدا خۆشەویست تر بێت لە لای خوا وەکو ئەم دە ڕۆژەی مانگی حاجیان ، وتیان :

---

[٢] صحيح البخاري رقم : (٩٦٩) وصحيح سنن الترمذي رقم : (٧٥٧) واللفظ لـهُ .

ئەنانەت جیهادیش لە پێناوی خوادا ؟ فەرمووی : تەنانەت جیهادیش لە پێناوی خوادا ، تەنها مەگەر پیاوێك نەبێت كە بە خۆی و ماڵ و سامانی یەوە دەربچێت بۆ جیهاد لە پێناوی خوادا و هیچیش لەوانە نەگەڕێتەوە .

لە بەر ئەمە (سعيد بن جبير) ئەگەر ئەم دە ڕۆژە بهاتبایە ئەوەندە هەوڵی دەدا و تێدەکۆشا بۆ خواپەرستی بە ئەندازەیەك كە نزیك بوو لە تواناداا نەبێت .

هەروەها لێی دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی : ((لا تُطْفِئوا سُرُجَكُمْ لَيالِي الْعَشْرِ)) .

واتە : شەوانی **دە ڕۆژی یەكەمی مانگی حاجیان** چراكانتان مەكوژێننەوە [مەبەستی ئەوەیە : شەونوێژ بكەن و قورئان بخوێنن و زیكری خوا بكەن] .

قال الحافظ ابن حجر العسقلاني رحمه الله : (وَالَّذِي يَظْهَرُ أَنَّ السَّبَبَ فِي امْتِيَازِ **عَشْرِ ذِي الْحِجَّةِ** : لِمَكَانِ اجْتِمَاعِ أُمَّهَاتِ الْعِبَادَةِ فِيهِ ، وَهِيَ الصَّلَاةُ وَالصِّيَامُ وَالصَّدَقَةُ وَالْحَجُّ ، وَلَا يَتَأَتَّى ذَلِكَ فِي غَيْرِهِ)[٣] .

واتە : ئەوەی ڕوون بێت لە هۆكاری تایبەت مەندێتی **دە ڕۆژی یەكەمی مانگی حاجیان** ئەوەیە : كە ئەم دە ڕۆژە بنەوای

---

[٣] فتح الباري شرح صحيح البخاري : (٢ / ٥٩٣) .

پەرستشەکانی تێدا کۆبووەتەوە ، کەوا بریتین لە نوێژ و ڕۆژوو و صەدەقە و حەج ، وە ئەمانەش لە هیچ کاتێکی تردا کۆنابنەوە .

وە پرسیار کراوە لە (شیخ الإسلام ابن القیم) : ئایا دە ڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیان چاکتر و گەورە ترە یان دە ڕۆژەکەی کۆتایی مانگی ڕەمەزان ؟

ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی : (ڕۆژانی **دە ڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیان** چاکترە لە ڕۆژانی دە ڕۆژەکەی کۆتایی مانگی ڕەمەزان ، وە شەوانی دە ڕۆژەکەی کۆتایی مانگی ڕەمەزان چاکترە لە شەوانی دە ڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیان)[٤].

وقال المبارکفوري : (الْمُخْتَارُ أَنَّ أَيَّامَ هَذِهِ الْعَشْرِ أَفْضَلُ لِيَوْمِ عَرَفَةَ ، وَلَيَالِي عَشْرِ رَمَضَانَ أَفْضَلُ لِلَيْلَةِ الْقَدْرِ ، لِأَنَّ يَوْمَ عَرَفَةَ أَفْضَلُ أَيَّامِ السَّنَةِ ، وَلَيْلَةُ الْقَدْرِ أَفْضَلُ لَيَالِي السَّنَةِ)[٥].

واتە : وتەی هەڵبژاردە ئەوەیە کەوا ڕۆژانی ئەم دە ڕۆژە چاکترە لەبەر ڕۆژی عەرەفە ، وە شەوانی دە ڕۆژەکەی کۆتایی مانگی ڕەمەزان چاکترە لەبەر شەوی قەدر ، چونکە ڕۆژی عەرەفە چاکترینی ڕۆژەکانی ساڵە ، وە شەوی قەدریش چاکترینی شەوەکانی ساڵە .

---

[٤] زاد المعاد : (١ / ٥٧) ، وقد نُقِلَ هذا القول عن شيخ الإسلام ابن تيمية أيضاً .

[٥] تُحفة الأحوذي : (٣ / ٥٣٠) .

*** ئەو کردەوانەی کە سوننەتن لەم دە ڕۆژەدا ئەنجام بدرێن :**

١ - **زۆر ئەنجام دانی کردەوە چاکەکان بە گشتی** : وەکو : قورئان خوێندن و زیکر کردن و فەرمان کردن بە چاکە و قەدەغە کردنی خراپە و جگە لەمانەش ، [بە بەلگەی فەرموودەکەی پێشوو : ((مَا مِنْ أَيَّامٍ الْعَمَلُ الصَّالِحُ فِيهِنَّ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنْ هَذِهِ الأَيَّامِ الْعَشْرِ ...))].

أ / **قورئان خوێندن** : قورئان خوێندن لە هەموو کاتێکدا سوننەتە و خێر و پاداشتی زۆر و گەورەیە : عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((مَنْ قَرَأَ حَرْفاً مِنْ كِتَابِ اللَّهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ ، وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا ، لاَ أَقُولُ : ﴿الٓمٓ﴾ حَرْفٌ ، وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ وَلاَمٌ حَرْفٌ وَمِيمٌ حَرْفٌ))[٦].

واتە : هەرکەسێك پیتێك لە قورئان بخوێنێتەوە ئەوا بە خوێندنەوەی تەنها ئەو پیتە چاکەیەکی بۆ هەیە ، وە چاکەش یەك بە دەیە ، ناڵێم : ﴿الٓمٓ﴾ پیتێکە ، بەڵکو (أَلِفْ) پیتێکە و (لاَم)یش پیتێکە و (مِیم)یش پیتێکە .

بەڵام ئەم خێر و پاداشتەی قورئان خوێندن - **لەو دە ڕۆژەدا** - زۆرتر و گەورەترە لە ڕۆژەکانی تری ساڵ ، کەواتە باشتر وایە موسڵمان لەم دە ڕۆژەدا زیاتر لە ڕۆژەکانی تر قورئان بخوێنێت .

---

[٦] صحيح سنن الترمذي رقم : (٢٩١٠) .

ب / **زیکر کردن** : بە هەمان شێوە زیکری خوایش لە هەموو کاتێکدا سوننەتە و خێر و پاداشتی زۆر و گەورەیە : عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (ﷺ) قَالَ : قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) : ((أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرِ أَعْمَالِكُمْ ، وَأَزْكَاهَا عِنْدَ مَلِيكِكُمْ ، وَأَرْفَعِهَا فِي دَرَجَاتِكُمْ ، وَخَيْرٌ لَكُمْ مِنْ إِنْفَاقِ الذَّهَبِ وَالْوَرِقِ ، وَخَيْرٌ لَكُمْ مِنْ أَنْ تَلْقَوْا عَدُوَّكُمْ فَتَضْرِبُوا أَعْنَاقَهُمْ وَيَضْرِبُوا أَعْنَاقَكُمْ ؟ قَالُوا : بَلَى ، قَالَ : ذِكْرُ اللَّهِ تَعَالَى)) ، فَقَالَ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ (ﷺ) : مَا شَيْءٌ أَنْجَى مِنْ عَذَابِ اللَّهِ مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ[٧].

واتە : ئایا هەواڵتان پێبدەم بە باشترین و پاکترین کردەوەتان لای خاوەنەکەتان و لە هەمووی زیاتر پلەوپایەتان بەرز بکاتەوە و چاکتر بێت بۆتان لە بەخشینەوەی زێڕ و زیو ، وە باشتر بێت بۆتان لەوەی کە بگەن بە دووژمنەکەتان و بدەن لە گەردنیان و ئەوانیش بدەن لە گەردنتان ؟ وتیان : بەڵێ ، فەرمووی : **زیکری خوای گەورە** .

ئەنجا (مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ ﷺ) فەرمووی : هیچ شتێك ڕزگارت ناکات لە سزای خوا وەکو زیکری خوا .

٢ ـ **نوێژ کردن** : بەوەی کە زوو بچیت بۆ نوێژە جەماعەتەکان و پەلە و پێشبڕکێ بکەیت بۆ ڕیزی یەکەم ، هەروەها ئەنجام دانی نوێژە سوننەتەکانی پێش و پاشی نوێژە فەرزەکان و شەونوێژ و زوحا

---

[٧] صحيح سنن الترمذي رقم : (٣٣٧٧) .

و سوننەتی دەست نوێژ ، هەروەها دەشتوانیت نوێژی (سوننەتی ڕەها / التطوع المطلق) زۆر بکەیت ، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((عَلَيْكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ لِلَّهِ ، فَإِنَّكَ لاَ تَسْجُدُ لِلَّهِ سَجْدَةً إِلاَّ رَفَعَكَ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً ، وَحَطَّ عَنْكَ بِهَا خَطِيئَةً))[٨].

واتە : زۆر سوجدە ببە بۆ خوا ، چونکە تۆ یەك سوجدە نابەیت بۆ خوا ئیللا خوای گەورە بە هۆی ئەو سوجدەیەوە پلەیەك بەرزت دەکاتەوە و تاوانێکیشت لە سەر لا دەبات .

٣ ـ **خێر و صەدەقە کردن** : عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ (ﷺ) قَالَ أَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) وَهُوَ يَقْرَأُ : ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ﴾ قَالَ : ((يَقُولُ ابْنُ آدَمَ : مَالِي مَالِي ، وَهَلْ لَكَ يَا ابْنَ آدَمَ مِنْ مَالِكَ إِلاَّ مَا أَكَلْتَ فَأَفْنَيْتَ أَوْ لَبِسْتَ فَأَبْلَيْتَ أَوْ تَصَدَّقْتَ فَأَمْضَيْتَ))[٩].

واتە : هاتم بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتێکدا کە ئەمەی دەخوێندەوە ﴿زۆر کردنی ماڵ و منداڵ سەرقاڵی کردوون﴾ فەرمووی : ئادەمیزاد دەڵێت : ماڵەکەم ماڵەکەم ، هیچ پارە و ماڵێك هی تۆ نییە تەنها ئەوە نەبێت کە : خواردووتە و تیاچووە یان لەبەرت کردووە و ڕزیوە و نەماوە یان ئەوەیە کە کردووتە بە صەدەقە و پێشت خستووە بۆ دوای مردنت .

---

[٨] صحيح مسلم رقم : (١٠٩٣) .

[٩] صحيح مسلم رقم : (٧٣٤٦) .

٤ - **ڕۆژوو گـرتن** : هەنـدێك لـە خێزانـەكانی پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویانە : ((كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَصُومُ تِسْعَ ذِي الْحِجَّةِ))(١٠).

واتـە : پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) نـۆ ڕۆژەكـەی مـانگی حاجیـان بـە ڕۆژوو دەبوو .

وە پرسیار كراوە لـە (الشیخ عبد العزیز بـن بـاز) سەبارەت بە كەسێك كە بۆچوونی وایە بە ڕۆژوو بوون لە دە ڕۆژی مانگی حاجیاندا بیدعەیە؟

ئـەویش فـەرمووی : (هَذَا جَاهِلٌ يُعَلَّم ، فَالرَّسُولُ (ﷺ) حَضَّ علـى العمل الصالــح فيها ، وَالصِّيَامُ من العمل الصالــح)(١١).

واتە : ئەو كەسە كە بۆچوونی وایـە كەسێكی نـەزان و جاهیلـە و پێویستە فێر بكرێت ، چونكە پێغەمبەر (ﷺ) هـانی موسڵمانانی داوە بۆ ئەنجام دانی كرداری چاكە لەو دە ڕۆژەدا ، وە ڕۆژوویش لە كردارە چاكەكانە .

٥ - **ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە بە تایبەت** : سوننەت وایـە بۆ ئـەو كەسانەی كە نەڕۆیشتوون بۆ حـەج و لـە عەرەفـەدا نـین و لـە ماڵدان كەوا بە تایبـەت لـە ڕۆژی عەرەفـەدا (٩ / **ذو الــحجة**) بـە ڕۆژوو بـن ،

---

(١٠) صحیح سنن أبـي داود رقم : (٢٤٣٧) .

(١١) نقلاً عن كتاب: (فضل عشر ذي الحجة وأحكام الأضحية) لسالــم العجمي ص : (٢).

چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((صِيَامُ يَوْمِ عَرَفَةَ أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ وَالسَّنَةَ الَّتِي بَعْدَهُ))[١٢] .

واتە : **ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە** چاوەڕوانم کە خوا بیکاتە مایەی کەفارەت و سڕینەوە و لێخۆشبوونی تاوانی ساڵێك لە پێشیەوە و ساڵێکیش لە پاشیەوە (واتە : ببێتە کەفارەتی تاوانی دوو ساڵ) .

٦ ـ **عومرە و حەج کردن** : چونکە حەج کردن لە ڕۆژی هەشتەمی مانگی حاجیانەوە (**٨ / ذو الحجة**) دەست پێدەکات بۆ ئەو کەسانەی کە بە (حەجی ئیسراحەتی دوای عومرە / حج التمتع) ئیحرام دەبەستن ، بۆیە پێویستە لە پێشدا عومرەکەت ئەنجام بدەیت ئەنجا لە ڕۆژی هەشتەمی مانگی حاجیانەوە ئیحرام بکەیت بۆ حەج .

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ١٩٦﴾ [البقرة] .

٧ ـ **زیکر کردن بە ووتنی : (الله أكبر ...) لەم دە ڕۆژەدا هەموو کاتێك** :

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْلُومَـٰتٍ ٢٨﴾ [الحج] ، قال ابن عباس (رضي الله عنه) : (**أيام العشر**) .

واتە : زیکری خوا بکەن لە ڕۆژە زانراوەکاندا کە بریتین لە **دە ڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیان** .

---

[١٢] صحيح مسلم رقم : (١١٦٢) .

قال الإمام البخاري في صحيحه : (كَانَ ابْنُ عُمَرَ وَأَبُو هُرَيْرَةَ (رضي الله عنهما) يَخْرُجَانِ إِلَى السُّوقِ فِي أَيَّامِ الْعَشْرِ يُكَبِّرَانِ ، وَيُكَبِّرُ النَّاسُ بِتَكْبِيرِهِمَا)[١٣].

واتە : (ابن عمر وأبو هريرة (رضي الله عنهما)) لە دە ڕۆژی مانگی حاجیاندا دەردەچوون بۆ بازاڕ و دەیانووت : (**الله أكبر ...**) و خەڵكیش بە دوایاندا دەیانووت : (**الله أكبر ..**) .

وجاء في فتوى اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء : (يُشرعُ التكبير المطلق في جميع الأوقات من أول دخول شهر ذي الحجة إلى آخر أيام التشريق ...)[١٤].

وقالوا أيضاً : (التكبير مشروع في عشر ذي الحجة مطلقاً)[١٥].

ئەم سوننەتە پشت لێهەڵكراوەش پێویستی بە زیندوو كردنەوە هەیە ، جا ڕەحمەتی خوا لەو كەسە بێت هەوڵی زیندوو كردنەوەی سوننەتەكانی پێغەمبەر (ﷺ) دەدات .

وە وتی : (**الله أكبر ...**) بەم شێوازە دەبێت : (**الله أكبر الله أكبر ، لا إلـهَ إلاّ الله ، والله أكبر الله أكبر ، ولله الحمد**)[١٦].

---

[١٣] فتح الباري شرح صحيح البخاري : (٢ / ٥٨٩) .

[١٤] فتاوى اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء ، الفتوى رقم : (١٠٧٧٧) .

[١٥] فتاوى اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء ، الفتوى رقم : (٩٨٨٧) .

[١٦] انظر : أحكام العيدين في السنة المطهرة ص : (٣٠) .

## ٨ ـ خۆ ئامادە كردن بۆ قوربانی ئەنجام دان :

ئەگەر كەسێك ویستی وا بوو قوربانی بكات ئەوا حەرامە لە تووكی هەموو لاشەی و نینۆكەكانی لابەرێت یان لێی بقرتێنێت و كەمی كاتەوە ، لە سەرەتای مانگی حاجییانەوە **(ذو الحجة)** تاوەكو قوربانییەكەی سەردەبڕێت .

عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رضي الله عنها) أَنَّ النَّبيَّ (ﷺ) قَالَ : ((إِذَا دَخَلَتْ الْعَشْرُ وَأَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يُضَحِّيَ فَلا يَمَسُّ مِنْ شَعْرِهِ وَبَشَرِهِ شَيْئًا))[١٧] .

وات‌ە: ئەگەر دە ڕۆژی یەكەمی مانگی جاجیان **(ذو الحجة)** هات ، وە كەسێك لە ئێوە ویستی هەبوو قوربانی بكات ، ئەوا با هیچ لە تووك و پێستی نەكاتەوە .

وفي رواية : ((فَلاَ يَأْخُذَنَّ شَعْرًا وَلاَ يَقْلِمَنَّ ظُفُرًا)) .

واتە : با نە لە تووكی لا بەرێت و نە نینۆكی بقرتێنێت .

وقد استدل بعض الفقهاء بهذا الحديث على أنَّ مَنَ (دَخَلَتْ عَلَيْهِ عَشْر ذِي الْحِجَّة وَأَرَادَ أَنْ يُضَحِّيَ ... **إِنَّهُ يَحْرُم عَلَيْهِ أَخْذ** شَيْء مِنْ شَعْره وَأَظْفَاره حَتَّى يُضَحِّي فِي وَقْت الْأُضْحِيَّة)[١٨] .

واتە : هەندێك لە زانایان ئەم فەرموودەیە دەكەنە بەڵگە لە سەر ئەوەی هەركەسێك ویستی هەبوو قوربانی بكات ئەوا حەرامە لە سەری

---

[١٧] صحيح مسلم رقم : (١٩٧٧) .

[١٨] شرح صحيح مسلم للإمام النووي : (١٣ /١١٦) .

هیچ لە تووك و نینۆکی لابەرێت هەتا قوربانی دەکات لە کاتی سەر بڕینی قوربانیدا دوای ئەنجام دانی نوێژی جەژن .

## ٩ ـ قوربانی کردن لە ڕۆژی جەژندا :

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡلُومَٰتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِۖ فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡبَآئِسَ ٱلۡفَقِيرَ ٢٨﴾ [الحج].

واتە : وە زیکری خوا بکەن لە ڕۆژە زانراوەکانی (دەیەمی یەکەمی مانگی حاجیان) لە سەر ئەو وولاخ و ئاژەڵانەی کە خوا کردوویەتی بە رزقیان بۆ قوربانی کردن ، جا لێی بخۆن و لێشی بدەن بە دەرخواردی هەژارانی بێنەوادا .

عَنْ مِخْنَفِ بْنِ سُلَيْمٍ (رضي الله عنه) قَالَ : كُنَّا وُقُوفاً مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) بِعَرَفَةَ فَقَالَ : ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ عَلَى كُلِّ أَهْلِ بَيْتٍ فِي كُلِّ عَامٍ أُضْحِيَّةً ...))[١٩].

واتە: ئەی خەڵکینە پێویستە لە سەر هەموو خێزانێك هەموو ساڵێك قوربانی بکات.

وَعَنْ جُنْدَبِ بْنِ سُفْيَانَ الْبَجَلِيِّ (رضي الله عنه) قَالَ : شَهِدْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَوْمَ النَّحْرِ فَقَالَ : ((مَنْ ذَبَحَ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ فَلْيُعِدْ مَكَانَهَا أُخْرَى ، وَمَنْ لَمْ يَذْبَحْ فَلْيَذْبَحْ))[٢٠].

واتە : ئامادەی لای پێغەمبەر (ﷺ) بووم لە ڕۆژی جەژنی قوربانیدا

---

[١٩] صحيح سنن أبـي داود رقم : (٢٧٨٨) .

[٢٠] صحيح البخاري رقم : (٥٥٦٢) وصحيح مسلم رقم : (١٩٦٠) .

و فەرمووی : هەرکەسێك قوربانی کردووە پێش ئەوەی نوێژی جەژن بکات با لە جیاتی ئەو قوربانی‌یە قوربانی‌یەکی تر بکاتەوە و ئەوەش نەیکردووە با بیکات .

*** مەڕێك یان بزنێك بۆ پیاوێك و خاو خێزانەکەی دەبێت** :

عَنْ عَطَاءَ بْنَ يَسَارٍ قَالَ : سَأَلْتُ أَبَا أَيُّوبَ الأَنْصَارِيَّ (رضي الله عنه) كَيْفَ كَانَتِ الضَّحَايَا فِيْكُمْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) ؟ قَالَ : ((كَانَ الرَّجُلُ يُضَحِّي بِالشَّاةِ عَنْهُ وَعَنْ أَهْلِ بَيْتِهِ فَيَأْكُلُونَ وَيُطْعِمُونَ))[٢١] .

واتە: پرسیارم کرد لە (أبو أیوب الأنصاري) : ئایا قوربانی ئەنجام دان چۆن بوو لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ؟ فەرمووی : لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) پیاو ئاژەڵێکی (مەڕێك یان بزنێك)ی دەکرد بە قوربانی بۆ خۆی و خێزانی و منداڵەکانی ، وە خۆیان لێیان دەخوارد و لێشیان دەدا بە خەڵك بۆ خواردنی .

*** قوربانی چێشتی جەژنە** :

عَنْ بُرَيْدَةَ بْنِ خَصِيبٍ (رضي الله عنه) قَالَ : ((أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ لاَ يَخْرُجُ يَوْمَ الْفِطْرِ حَتَّى يَطْعَمَ ، وَلا يَأْكُلُ يَوْمَ الأَضْحَى حَتَّى يَرْجِعَ فَيَأْكُلَ مِنْ أُضْحِيَّتِهِ))[٢٢] .

---

(٢١) صحيح سنن الترمذي رقم : (١٥٠٥) ، وصحيح سنن ابن ماجه رقم: (٢٥٦٣).

(٢٢) السنن الصغرى للبيهقي رقم : (٦٩١) وصحيح سنن الترمذي رقم :(٥٤٢) وصحيح سنن ابن ماجه رقم : (١٧٥٦) .

واتە : پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان لە ماڵ دەرنەدەچوو هەتا خواردنی نەخواردایە ، وە ڕۆژی جەژنی قوربان خواردنی نەدەخوارد هەتا دەگەڕایەوە لە نوێژی جەژن ئەنجا لە قوربانییەکەیی دەخوارد .

**تێبینی** : هەرچەندە قوربانی ئەنجامدان لە سێ ڕۆژەکەی دوای جەژنیشدا (أيام التشريق) دروستە بەڵام باشتر و خێرتر وایە کە لە ڕۆژی جەژندا سەرببڕێت لەبەر سوننەتەکە و ئەنجا دەشکەوێتە نێو دەیەم ڕۆژی مانگی حاجیانەوە کە کردەوەی چاکە تێیدا فەزڵ و خێرەکەی تایبەتە ، بۆیە باشتر وایە لە دەیەمین ڕۆژدا قوربانی ئەنجامبدرێت .

وە بۆ زیاتر شارەزا بوون لە (**ئەحکام و ئادابەکانی قوربانی کردن**) بە وردی ئەوا ئەم کتێبە بخوێنەرەوە :

# چۆنێتی قوربانی کردن

# لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ)

نووسین و ئامادەکردنی : **مامۆستا محمد عبد الرحمن لطيف**

بەکالۆریوس لە زانستە شەرعییەکاندا

**وتارخوێنی مزگەوتی (شێخ إبراهيم) / کەلار**

**لە بڵاوکراوەکانی**

(**کتێبخانەی : زانـــــستی بەسوود**) / **کەلار**

## لە بەرهەمەکانی دانەر

١ ـ **سێ بنچینەکەی بیروباوەڕ و بەڵگەکانیان** ـ چاپی پێنجەم ـ .

٢ ـ **بیروباوەڕت وەربگرە لە قورئان و سوننەت** ـ چاپی دەیەم ـ .

٣ ـ **پوختەیەك لە بیروباوەڕی ئیسلامەتی** ـ چاپی پێنجەم ـ .

٤ ـ **کورتەیەك لە فیقهی سوننەت و قورئانی ئازیز** ، کە بریتی‌یە لە وەرگێڕانی کتێبی : (الوجيز في فقه السنة والكتاب العزيز) ـ ئامادە دەکرێت بۆ چاپ ـ .

٥ ـ **برایەتی نێوان موسڵمانان** .... ـ چاپی پێنجەم ـ .

٦ ـ **لە گەڵ کێدا دادەنیشیت و هاوڕێیەتی کێ دەکەیت ؟** ـ چاپی حەوتەم ـ .

٧ ـ **چۆنێتی قوربانی کردن لە سەردەمی پێغەمبەردا** (ﷺ) ـ چاپی چوارەم ـ .

٨ ـ **کاتی پارشێو و بەربانگ کردن لە سەردەمی پێغەمبەردا** (ﷺ)ـ چاپی چوارەم ـ .

٩ ـ **حوکم و ئادابەکانی قەرزدان و قەرزکردن و قەرزدانەوە** .... ـ چاپی یەکەم ـ .

١٠ ـ **فەتوای گەورە زانایانی هاوچەرخی ئەهلی سوننە و جەماعە سەبارەت بە حوکمی حزبایەتی و جیاوازی و پارچە پارچەگەرێتی** ـ چاپی دووەم ـ .

١١ ـ **گەڕانەوە بۆ لای زانایانی ئەهلی سوننە پارێزەرە لە تیاچوون و گومڕابوون** ـ چاپی یەکەم ـ .

١٢ ـ **لە ئیسلامدا چەندین گروپ و حیزب نییە بەڵکو کۆمەڵی موسڵمانان و خەلیفە هەیە** ـ چاپی یەکەم ـ .

١٣ ـ حوکمی کۆمەڵ و حزبە ئیسلامییەکان لە نێو کۆمەڵگای موسلمانانندا / فەتوای هەردوو شێخ : (ابن باز) و (ابن العثيمين) ـ چاپی یەکەم ـ .

١٤ ـ زنجیرەی ئافرەت لە سایەی ئیسلامدا :

**یەکەم** : ئافرەتان و فێربوونی زانستی شەرعی ـ چاپی شەشەم ـ .

**دووەم** : زاناترین ئافرەتی دونیا ـ چاپی شەشەم ـ .

**سێیەم** : لە دایك بوونی کچان و سەرهەڵدانەوەی خەصڵەتێکی سەردەمی نەفامی و جاهلی لە سەدەی پێشکەوتووی بیست و یەکدا !!! ـ چاپی شەشەم ـ .

١٥ ـ ئایا لەم دەرگایەت داوە ؟ (پاڕانەوە لە خوای پەروەردگار) ـ چاپی چوارەم ـ .

١٦ ـ فەزڵ و گەورەیی و حوکمەکانی دە ڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیان لە سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەردا (ﷺ) ـ چاپی شەشەم ـ .

(اللهُمَّ اجعلْ خيرَ عمري آخرهُ ،

وخيـر أعمالـي خواتِـمَهـا ،

وخيـرَ أيامـي يـوم ألقـاك)

خوێنەری بەڕێز :

ئەگەر هەر تێبینی‌یەك یان هەر پرسیارێکت هەبوو سەبارەت بە ناوەڕۆکی ئەم کتێبە ئەوا پەیوەندی بکە بەم ژمارەیەوە : (٠٧٧٠١٩٨٨٦٢٣) .

# هەندێک

# لە بەرهەمەکانی ئامادەکار


























ژمارە سپاردنی ٩١٩ ی ساڵی ٢٠٠٥ ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە